# ئاگر و گوڵ

خالید دلێر

---

چاپخانەی دار السلام - بەغدا

## ئاگرو گوڵ پێشکەشە :

- بەو نەبەردانەی ئاگـــر هەڵئەکــەن بۆئەوەی درزکو داڵی پێ بسووتێنن ٠

- بەو دڵسۆزانەی لە شوێنی ئەو دڕرکو داڵــــە سووتاوەدا گوڵ ئەچێنن ٠

- ( بەو ئاگرە کە دڕرکو داڵ ئەسووتێنێ ) !!

- بە گوڵ کە نموونـــەی جـــوانیو نیشـــانەی خۆشەویستی یە ٠

٢٤ی - تشرینی دووەمی - ١٩٦٨

خالید دلێر

# سەرەتا

ئەم کوردستانەی ئێمە ، بە ئاوو هەوای ساف‌و بێ گەردی ، بە دارستانانی چڕو زەبەندی ، بە دەشتە پانەکانی پڕ شیناوەردی ، بە چۆماوو گۆماوی، بە دیمەنەکانی دڵڕفێن‌و خۆ کردی وەکوو ( تابلۆ ) یێکی نایاب وایە کە بە دەست‌و پەنجەی هونەرمەندێکی چازان‌و لێزان نەخش کرابێ .

بەهاران دەشت‌و کێوو نەهاڵ‌و قەد پاڵ ، دۆڵ‌و دەرەو هەورازو نشێوی وولات بە رایەخی مەخمەرینی سەوزە گیا فەرش دەکرێ‌و بە گوڵ‌و گوڵوکی ڕەنگاو ڕەنگ دەڕازێنرێتەوەو چریکەی بولبولان‌و جریوەی هەل‌و باڵندە دەگاتە کەشکەشانی فەلەک‌و بەزمێکی شایانە لە هەموو کەلێن‌و قوژبنێکی بەرپا دەبێ . خێلاتی مەرِرداری کورد چادرو

چیغیان تێك ئەنێن و لـــە هەموو لایێکی کوردســتانەوە بەرەو کوێستانان ئەکەونە ڕێ •

نم نم باران بۆ ئەوانەی لە کۆساران لـــە بــن ڕەشـــمالاّن دانیشتبن وەك زەم زەمـــەی مۆسیقایێکی بەسۆز وایەو بۆ ئەوانەش لە پێ دەشتەکان دانیشتبن ترووسکەی ئاگری ڕەشمالاّن لـە هەوای پرر هەورو هەلاّ دا وەك جریوەی ئەستێرانە لـە ئاسمانی شەوێکی شەوەزەنگی‌دا • شاعیرێك لە شاعیرە بێ ناوەکانمان بە وەحی ئەودیمەنە ووتوویە :

ترووسکەی ئاگری سیا ماڵت بۆ
خۆش خۆش مەدرەوشا جەدامانەی کۆ

بە هاوین کاتێ پیاو چاوێك بە دەشتەکانا ئەخشێنێ دەبینێ گوڵی زێرڕینی دەغڵو دان وەکـــوو کۆگـای زێڕرو خەزینەی لەچەرو چاو چنۆکان بەسەر یەکـا کەوتوە ، لە لایێك دروێنەوانان داسی تازە ساویان لە قەفی گەنم و جۆو دانەوێڵە خستۆتە کارو بـە صەدان ( مەلۆ )یان لە شوێن خۆیان بەجێ هێشتوەو لەبـــەر خۆرە تاوی هاوین بۆ کۆکردنەوەی بژیوی زســتان

جواناو ئه ڕێژن . کۆمەڵێکی تر جووتیار بە ( ئۆحه ،
ئۆحه ) دوای چەند گایەکی جەلە کراو کەوتوونو
خەریکی ( گێره )ن ، هەندێکی تر ( شەنه ) یان بە
دەستەوەیەو پەیتا پەیتا دائەنەونەوەو هەڵدەستنەوە ،
خەرمان سوور ئەکەن .

له باخـــان دارو درەخت وەکوو نۆ بووکـــان
خۆیان بە حەوت قەڵەم ئارایش داوەو لە ژێر قورسایی
خشڵی میوەی ڕەنگاو ڕەنگی هەمە ڕەنگدا ســەری
لكو پۆپیان داخستوەو چاوەنواری پەنجەی باخەوانن
که دەستی بەرێو سەری شەرمیان پێ هەڵبرێ .

پاییز دیمەنێکی تری هەیە ، گەڵای داران هەر
وەك ترسی سەرمای زستانیان ڕێ نیشتبێ ، ڕەنگیـــان
زەرد دەبێو یەك لە دوای یەك هەڵ دەوەرن ، ڕایەخی
سەوزە گیا کاڵ دەبێتەوەو ڕەنگی دەپەڕرێ ، سەرتاپا
خواری وولات کراسێکی « تافته » ی زەرد لەبـــەر
دەکا ، باڵندە دەست دەکەن بـــە کۆچو ڕەو لـــە
کوێستانەکانی کوردستانەوە بەرەو گەرمیانێ دەکەونە
ڕێ،یان له پەسارو ، با پەنایان خویان کروشم هەڵدێنن

خێلات لە هەوارانەوە بەرەو خوار دەبنەوە ، پێشەنگی سوپای زستان هەڵدەکاتە تەپو تۆزو هاررەو گرمەی بـا لەشیوودۆڵاندا هەنگامـــە ئەگێرری‌و دانشـتوان‌و باڵندەو گیانداران ووشیار ئەکاتەوە کـە خۆیان بـــۆ بەربەرەکانی زستان ئامادە بکەن‌و ئەوەی هیچی لە بارا نی‌یە بلا مەیدان چۆڵ کاو را بکات، کتـو پرر تیپی سەرماو سۆڵ‌و کرریوەو شلیوە دەدەن بەسەر وولاتا ، دەست دەکەن بە داگیر کردنی‌و خەلاتی سپی بەفـر هەموو شتێك لە خۆیـــەوە ئەپێچێ‌و لێفـــەو بەرەی فەقیران ئەدرری .

ئەم دیمەنە جۆر بە جۆرانە ، ئەم گۆررانە یەك لـــــە دوای یەکەی بەسەر وولاتماندا دێت‌و خاکمان وەکوو تازە بووکی دەوڵەمەندان هەر دەمە کراسێکدا دەکەنێ‌و کراسێك دەبەر دەکا ، هـەر کاتەی بەرگێ دەپۆشێ‌و هەر ساتەی نـــازێ دەفرۆشێ ، جـــارێ دەگری‌و جـــارێ پێدەکـــەنێ ، فەصڵێ دەبەخشێ‌و فەصڵێ دەستێنێ ، بـــە هەزاران جـوور دەگـــرێ‌و دەبارێنێ ، دەگۆرری‌و دەگۆرێنێ ، لەگەڵ هــــەر

گۆررانێك دڵی ئینسان دادەخورپێنێو پـــاو ئەخاتـە دەریای بێ بنـــی ( هەست )و دەیهاوێتە ناو ( بیر )ی قووڵی ( بیر)ی وردو ( ورد بوونەوە )و مێشـکی بە هەزارانو یەك ( هۆ ) ئەجووڵێنێ •

- ٢ -

ئاو لە جێگایەکا پوونگی خواردەوە رێگایەك بۆ خۆی ئەکاتەوە ، بیریش هـــەر وایـــە کە لە مێشکا پوونگی خواردەوە پێویستی بە وەدەرخستن دەبێ ، ئەویش بـە ( تەعبیر ) لـــە هەستی دەروون پێکدێو هەستی دەروونیش بە قسە دەرئەبرردرێ • قسـەش دوو جوورە قسەمان هەیە ، قســـەی بە ( وەزن )و ( قافیە ) کە پێی ئەگوترێ ( شـیعر ) • ئـــەوەی ( وەزن ) و ( قافیە )ی نەبێ ( نەسر )ە •

شیعرو شاعیریو کوردستان لێك بێگانە نـین ، دیمەنی رەنگاو رەنگی خۆرسکاوی کوردستان ، ژیانی خەڵــك ، کارەساتەکانی مێژوویی وولات هەمیشـە سەرچاوەی (وحی ) و (ئیلهام ) بوون بۆ خوێندەوارو

نەخوێندەواری کوردو هانی داون (تەعبیر) لەکوڵوکۆی دەروونی خۆیان بکەن . هەر بۆیەشە کە لـــە چاو چلۆنایەتی بـاری خوێندەواری وولات ، کوردسـتان شاعیری زۆرن . سویەهبود ( رەزمارا ) لـــە کتێبی ( جغرافیای نظـامی کوردستان )دا دەڵـێ : « خەڵکی کوردستان بە تەبیعەت شاعیرن » . کۆنترین نموونەی شیعری کوردی وەکوو باس ئەکرێ گۆیا ئەو پارچە شیعرەیە کە لەسەر پێستی ئاسك نووسـراوەو لـــە ئەشکەوتەکانی ( جێنشـــان ) و ( هـــەزار مێـــرد ) دۆزراوەتەوەو تاریخی دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای بڵاو بوونەوەی دینی ئیســـلام لەکوردسـتان . ئەمـــەش نموونەیەکی ئەم شیعرانەیە :

« هرمزگان رمان ، ئاتران کوژان
وەشان شاردەوە گەورە گاوران
زنو کنیکان وەدیل بشیان
مێرد ئازا تلین ، جە رووی هوونیان »[1]

---

**(١) رەشید یاسمی لە لاپەرە ( ١٢٩ ی کتێبـە کەی (کورد) باسی ئەکا و علاءالدین سجادیشـــس لە لاپەررە (١٣٠)ی ( مێژووی ئەدەبی کوردی) دا لێیوەرگرتووە.**

ئەم پارچە شیعرە ئەگــەر راست بێ نموونەی زمانی کوردیمان لە سەرەتای ئیسلاما پێشان ئەدات و وەکوو ئەبینین لەگەڵ لەهجەی ئیمڕۆی شارەزوور جــاوازێکــی ئــەوتۆی نییە ، جگــە لــەوەی ( وەزن ) ێکی ئەو سەردەمەی شــیعری کوردیمان ئەداتە دەست و ئەگــەر سەرنجی لێ بدەیــن دەبینین دەگــەڵ وەزنی گۆرانی ئیمڕۆی کوردی وەکــوو یەکن ، با بزانین :

وە یادت مەیۆ ، شەوەکەی لێو جۆ
ئەزیەت کردن من ، مــەکەو لاوەی تۆ

هەر ماڵی گێسکی ، خۆم تەنیا گۆڕێ
نەزری ئەڵلا بوو یارم نەتۆرێ

ئەم دوو شیعرە گۆرانی یەکن کە لــە ناوچەی ( جوانڕۆ )و دەورو بــەری ( کرماشان ) داکەوتوەو دوکتۆر ( لطفعلی صورتگر ) استادی دانشگای تاران ساڵی ١٩٣٨ لـە ژمارەیێکی گۆڤاری ئەدەبی (مهر )دا لە ژێر عنوانی ( یك شــعر آسمانی ) باسی دەکات ،

وەکوو ئەبینین (وەزن) یان هەر (وەزن)ی (هرمزگان زمان .... هتد ) . .

- ٣ -

سەرەرای هەموو ئەو تەنگ‌و چەڵەمەو کۆسپانەی لەبەر چلۆنایەتی تایبەتی کوردستان هاتۆتە سەر رێگای پێشکەوتن‌و خزمەتی زمانی کوردی‌و سەرەرای ئەوەی سالآنی دوایی چەرخی رابردوو خەڵك بە کوردی‌یان نە دەنووسی‌و لە چەرخی بیستەمیشدا گەلێك جار نەك هەر بو لەناو بردنی بەڵکوو بو تواندنەوەو شوێنەوار بررینەوەی زمان‌و نەتەوەی کوردیش لە لایەن شوفێنی‌یە رەگەز پەرستەکانەوە هەوڵ‌و تەقەلا یەکی زۆر دراوە ، هێشتا بە دەیان شاعیرو ناوداری وەکوو ( ئەحمەدی خانی ) و ( مەلای جزیری ) و ( مەولەوی تاوگۆزی ) و ( مەلا مستەفای بێسارانی ) و ( مەلا خدری نالی ) و ( مستەفا بەگی کوردی ) و ( شیخ رەزای تاڵەبانی ) و ( مەلا ساڵحی حەریق ) و ( حاجی قادری کۆیی ) و

( میرزا رەحیمی وەفایی ) و ( شێخ بابای غەوسابانی ) و ( میرزا مستەفای دلی دلی ) لە گۆشـــەو کەناری کوردستان ، لـە کونجـــی ( حوجرەی فەقێ ) یان و نوزبنی ( تەکیە ) کان لەبەر رووناکی ( چـرای رۆن گەرچەك )و ( قوتیلەی نەوت ) ، بە ( دەقنە )و ( نانی راتبە) خۆیان پێ گەیاندوەو هەر یەکەیان لە گەنجینەی ئەدەبی کوردی‌دا ( چاوە ) یێکی تایبـەتی‌و گەورەی بۆ خۆی کردۆتەوە •

لەپاش شـــەرری یەکەمینەوە تا ئێستا نەتەوەی کورد بە دەیان شاعیری تری وەکوو ( بێ کـەس ) و ( پیرە مێرد )و ( گـۆران )و ( هێمن )و ( خاڵەمین )و ( عەتری گلۆلانی )و ( حەقیقی بۆکانی )و ( أحمـــد نامی جزیری ) پێ گەیاندوە کە لـــە مەیدانی شیعرو ئەدەبدا هەریەکەی ( کەڵە مێرد ) یکە بۆ خۆی •

ئەگەر لە سایەی نووسینەوە ، ئیمرۆ دەتوانین لە مێژووی ئەدەبی زمانەکەماندا ناوی دەیان بەڵکـوو سەدان شاعیر بدۆزینـەوە کـــە ئاسەواریکیان لەپاش بەجێ ماوە ، دەش توانین بە دەیان ( شـــاکار )ی وا

پێشان بدەین کە بە درێژایی مێژوو دەم بە دەم و زار
بە زار گەڕاوەو گەڕاوەتەوە تـا گەیشتووتە ئێمە ، بێ
ئەوەی کەسێ خۆی ماندوو کردبێ بزانێ خاوەنـــی
کێیە ، باوەڕ ناکەم کەسێك هەبێ بزانێ خاوەنی ئەو
شاکارە ئەدەبی‌یانەی کـە لـە کوردەواری‌دا بە ناوی
( بەیت ) مەشهوورن کێن • بەیتی ( کاکـــە مـــەم‌و
خاتوزین ) کە ( خانی ) مەم‌و زینەکەی خۆی لەسەر
بینا ناوەو ( لاسە گوڵ‌و خەزاڵ )و ( شۆررە لاـــی
باڵەکی‌یان )و (خەج‌و سیامەند )و (قەڵ‌و گوڵە زەرد )و
( دمدم ) و ( شێخی سەنعان ) و ( سێلم ئاغا )و (زەنبیل
فرۆش )و ( خانزادی سۆران ) هـەر یەکـە دەنـکە
گەوهەرێکن لەو ( ملوانکە ) نایابەی کە پێی دەڵێین
( شیعرو ئەدەبیاتی کوردی )و هـــەر یەکە دەست‌و
نەخشی ( شاعیر ) ێکی ووردە کە وەکـوو ( سەربازی
بێ ناو ) بێ ئەوەی ناوێك لە خۆی بەجێ‌بێڵێ ،میراتێکی
بەنرخ‌و هێزای بۆ نەتەوە کەی بەجێ هێشتوە • ..

- ٤ -

پاش ئەوەی کە لە خوێندنەوەی ئەم سەرەتایە

دوروو درێژە بوونەوەو تۆزێ مێشکتان هاتەوە سەر خۆ،ئەوسا دەست بکەن بە خوێندنەوەی ( ئاگرو گول)، ئەمەش بەرهەمی شاعیرێکی ترە کە لە بەزمی شاعیرانی کوردستان‌دا دەنگی بەرز کردۆتەوەو خەریکە بە چریکەی خۆی مەست‌و سەرخۆشمان ئەکات. ئەستێرە یەکی تازە یە لە ئاسۆی ئاسمانی شیعرو ئەدەبی کوردی‌دا پرشنگ ئەداتەوە ، مەلەوانێکی نوێ‌یە لە دەریای بێ بنی ئەدەبیاتا ، باسك‌و با ئەکوتێ‌و پەل ئەهاوێژێ .

خالید دلێرە بە شێوەی کۆن‌و نوێ ، شیعری تەررو ئاوداری دلی دلداران ئەخاتە خولیاو لە چۆل‌و بیابانی ( سەودا ) دا ( سەودا سەر ) یان ئەکا (دلدار)ی نەفام کە ( تەمەن زۆری لێ کردوە بە بیانوو ) تێ دەگەیەنێ :

نەخێر سەهووی ، من خۆم بەلاوئەزانم
شایستەی نازدارێکی نەو جەوانم
هەموو گیانم لاوێتی‌و جۆش‌و سۆزە
لە ناو دلما ( هەمیشە هەر نەورۆز ).

نیشتمان پەروەرێکی بە جەرگ‌و نەگۆڕە ، لە پێناو کورد ، لە پێناو کوردستان بە بیر ، بە باوەڕ ، بە عەزمی پۆلایین خەبات دەکات ، وەکوو خۆی ئەلێ :

گەلێ سەختم
پوختەو نەختم
لەسەر مان‌و نەگۆڕانم
زۆر زۆر دڵنیاو بە جەختم

کاك خالید ، کە ڕێگەیەکی گرتوە بەری نادا ، ڕێگەی خزمەتی میللەتی کوردو هەموو میللەتانی تر ، ڕێگەی دوژمنایەتی‌و بەربەرەکانی لەگەڵ ئیمپریالیزم‌و ، پشتی داوتە هێزی میللەت‌و بڕوا ، و خەبات ئەکات .

کاك خالید کوڕی ـ عبد الواحد ـ ، مەشهوورە بە ( دلێر ) ، لە ساڵی ١٩٣٣ لە شاری کۆیە لە دایك بووە‌و قوتابخانەی سەرەتایی‌و ناوەنجی ( متوسطە )ی لە کۆیەو سانەوی لە کەرکووك تەواو کردووەو لە ( شەریکەی نەوت ) لە کەرکووك کرێکار بووە .

هێندێك شیعرەكانی خالید دلێر بە پەرش‌و بڵاوی لە رۆژنامەی « ژین » و « خەبات » و « شەفەق » و « هیـوا » و هێندێكیش ساڵی ١٩٥٧ لـە نامیلكەی « گزنگی هەتاو » دا بڵاو كراوەتەوە .

ئەگەرچی زۆربەی زۆری شیعرەكانی كاك خالید ( مۆر )ی نیشتمان پەروەری‌و ئازادیخوازی‌و دژمنایەتی ئیمپریالیزم‌و كۆنە پەرستی یـان پیوەیەو مێشكی خوێندەواران بە ( بۆن‌و بەرامـە )ی بیرورای پێشكەوتوانە زاخاو ئەدەن ، دەبینین جارو بارە لەسـەر ( رقعە )ی ( شطرنج العارفین )ی خەیاڵا ( مـۆرە )ی هەستی دەروون لەباتی ( دوو شەش ) بێنێ ( خـاڵ خاڵ )ی هێناوەو كاك خالیدی داوەتە دەست (شامار)ی سەودای دڵداری ، ئەویش ( قەپ )ی كردوە بـە ( رەفیسكە ) و ( مەچەك )ی داو لە ( عرشی عظیم )ی شیعری سیاسی‌یەوە رای كێشاوە بو (وادی) هەڵبەستی دڵداری .

( درۆزن ) ، ( هەوەڵ دڵداری ) ، ( وەرامێك )و ( داوای نامە ) نموونـەی جۆش‌و خرۆش‌و ملـەو

بەربەرەکانی دەروونی شاعیرنو دەری دەخەن کە کاک خالید ئەو ( عابد )ە نی یە لەسەر ( کەوڵو پۆست ) دانیشتبێو وازی لە ( دنیاو ما فیها ) هینابێو ، تەنها جارێ بو کە هات بە سەرما دلداریم تووش بوو ، کە لە ( هەوەڵ دلداری ) دا ووتوویە تەنها ( چاو بەست ) یکی شاعیرانەیەو هیچی تر ٠

واچاکە پاش ئەم هەموو درێژ دادرری یە سەرەتاکە بە داوای سەرکەوتنو پێشکەوتن بو خالیدو هەموو شاعیرو ئەدیبە پێشکەوتووە کانمان دوایی پێ بهێنم ٠ ئاواتە خوازم هەر کەس لەبەر خۆیەوە ئەوەندەی بۆی دەکرێو پێی دەکرێو بەو جۆرەی پێی دەکرێ لە خزمەتی کوردو کوردستان ، لە گەشە پێ کردنی زمانو شیرو ئەدەبی کوردی دوا نەکەوێ ٠

عیسا

١٥-٣-١٩٦٩

# یەك دوو قسە

خوێندەواری بەرێز

نازانم بە مانەی بەر دەستان بڵێم ( شیعر ) یان نا ؟ بەڵام ناچارم وایان ناو بنێم چونکە لەمەو پێش هەندێکیانم بەم ناوەوە بڵاو کردۆتەوە •

ئەم شیعرانە ، زۆربەی شیعرەکانمە • هەندێ شیعری سەر دەمی قوتابخانەی سەرەتایی‌و متوستەم ماوە کە لەم کاتەدا لەبەر دەست نەبوون ، لەگەڵ چەند پارچەیەکی تریشدا کە ئێستا بە لە ناو چوو ئەژمێرێن ، هەروەها چەند شیعرێکی کەش کە لە دەمیکەوە دەستم پی کردوون‌و تا ئێستا تەواو نەبوون !! هیوادارم لە هەلێکی تردا بتوانم ئەوانەشتان پێشکەش بکەم •

ئەم شیرانە هەموو شیرە بڵاوکراوەکانمیان لەگەڵدایە ، یەکەم شیری بڵاو کراوەم نەبێت کە بە ناوی ( بەهاری ساڵی تازە ) وە لە رۆژنامەی ( هەولێر - أربیل ) لە بەهاری ساڵی ١٩٥١ دا بۆیان بڵاو کردمەوە ، زۆرم هەوڵدا دەسم نەکەوتەوەتا بیخەمە تەك ئەمانەوە . هەر خێرۆمەندێ دەسی کەوێت و بۆمی بنێرێت زۆر سوپاسی ئەکەم .

بۆ ناوی ئەم کۆمەڵە شیرەش ، چەند ناوێکم بە خەیاڵدا ئەهات . ( یەکەم شەهید ) ، کە شیرێکم هەیە بەم ناوەو ئەمەویست لەگەڵ ئەمانەدا بڵاوی بکەمەوە بەڵام دەستم نەکەوتەوە . جارێ وازم لەم ناوە پیرۆزە هینا بەڵکوو بتوانم بەشی دوومی کتێبی شیرەکانم بەم ناوەوە ناوبنێم . ناوی ( بێبەشی ) کە لەگەڵ شیرە نستمانی و دڵداری یەکاندا رێك ئەکەوت ، بەڵام لەبەر ئەوەی نەختێ مانای وورە بەردانی تێدایە وازم لەمەش هێنا . ماوەیەکیش چاوەروانم کرد ، زۆریشم لە برادەرو دۆستان پرسی لە ( ئاگرو گول )م باشتر دەس نەکەوت . هەرچۆنی بێت ، هیوادارم بە

دڵتان بێت‌و لـه کەم‌و کورری‌یەکانیشم نەبوورن ، چ ڕێگا یەك بە باش ئەزانن بەو ڕێگایە بیان خەنە بـەر چاوم •

لە دواییدا سـوپاسی مامۆسـتای خەباتکـەر کاك ( عیسا ) ئەکـەم کەبـە سـەرەتا جوانەکەی نرخی کتێبەکەمی زیاد کرد ، وە سوپاسی کاك : جمال بەختیـار ، عبدالله سـالار ، کامل أحمـد معروف ئەحمەد تاقانەو بەختیـار مستەفا ئەکـەم کـە بە وێنە جوانەکانیان کتێبەکەیان بۆ رازاندەمەوە • ئیتـر بەختیاریتان بۆ ئەخوازم •

بەغدا ـ مارتی ١٩٦٩

خالید دلێر

# کورد و ئاشتی

**ئەم هەڵبەستەیە لە رۆژنامەی (ژین)ی ژمارە (١١٩٣)ی ساڵی (٢٩)، رۆژی ١ نیسانی ١٩٥٤ دا بڵاوکراوەتەوە .**

لاوی کورد ئاشتی دەوێ ، داوای سەلام بۆگەل دەکا
بۆ بەجێ هێنانی داوای هێزی خۆی کومەڵ دەکا

ئارەزوویە نیشتمانی پێشکەوێ‌و خۆش‌بێ نەوك
حەز لە کاولگەی بە وێنەی بیشەوو جەنگەڵ دەکا

مۆری خۆی خستۆتە سەر پەیمانی ئاسایشی جیهان

کۆتری ئاسایشە ، خۆی دوور لە داڵو قـەل
دەکـا

میللەتانی سەر زەمین گشتی بە هاوڕێ دائەنێ
بۆیە بۆناو باخی ئاشتی خۆی بە وێنەی مـەل
دەکـا

داری ئاسایش رواوە ئەو مەلە ، کرمی بنی
بەو دەنوو کانەی لەگەڵ خاك لاشەکەی تێکەڵ
دەکـا

شیری برروایی لە دەس دایـەو ئەبارێزێ بەری
گەر دزێ هات بیررنێ ، بەو شیرەدەستی پـەل
دەکـا

کورد لە ئیستعماری بیسی چەژتووە ئازارو دەرد
کۆیلەیی ناکا ئیتر خۆی دوور لـــە کۆتوتەل
دەکـا

بۆ ئەوەی پەیمانی پاکستان و تورکی گوڕر بکا[1]
شان بە شانی هۆزی عارەب چاوەڕۆنی هەڵ
دەکـــا

کورد بە بۆنەی جەژنی نەورۆزی سلاوی پڕر
دڵـــی
پێشکەشی هۆزانی گیتی ، ئاشتی خوازو کەڵ
دەکـــا

بەغدا ـ شوباتی ـ ١٩٥٤

---

(١) ئەم بەندە لەبەر سروشتی ڕوژنامەکـــەو باری
سیاسی ئەو ڕۆژە لە ڕۆژنامەکەدا بلاو نەکرایەوە

# کۆتر

**ئەم هەڵبەستەیە لە ڕۆژنامەی ( ژین )ی**
**ژمارە (١١٩٦)ی ساڵی ( ٢٩ ) ، ڕۆژی ٢٢**
**نیسان ١٩٥٤ دا بڵاو کراوەتەوە ٠**

کۆتر ئەی باڵداری جوان
ئەی ڕۆح سووکی دوور لە زیان

چەندی لێت وورد ئەبمەوە
بە بیرو بە هەستمەوە

لێت نابینم هیچ ستەم
گەورەو بچووك ، زورو کەم

مەلێکی بێ زبانی
لە ئادگار جوانی

ئەو دەنووکە بچکۆلە
ئەو پەڕرە نەرمو نۆلە

ئەو قاچە بێ نینۆکە
پەڕی دەوری وەك لۆکە

ئەو چاوە ، ئەو ئەبرۆیە
گشتی شاهیدی تۆیە

کە ئەو شتەی داواتە
بۆ گشت گەلان ئاواتە

ئەویش ژینی شادی‌یە
ژینی پڕر لە دادی‌یە

میللەتانی درووی جیهان
وەك پەیامبەر سولەیمان

نێ گەیشتن گوفتارت
بێ زیانی رەفتارت

بۆیە لە دەستەی مەلان
ئەتۆیـــان کرد بە نیشـــان

نیشـــانەی ئاشتی خـوازی
دڵپاکی ، پـاك نیـازی

شـــادبێ هاوڕێ پیگاسۆ
وەك تۆی هینـــایە ئاســـۆ

ئاســـۆی ئاشـتی جیهانی
هی ئەنجـــام کامەرانی

چەند خۆشـــە گشت گیـــان لەبەر
وەك تۆ خۆی دوور کا لە شـــەرر

خێوی تەماع لا بچـــێ
دررووی لە چـــاو را بچێ

ئەوســـا گشت لا بـــە شـادی
بە ئاســـودەو ئـــازادی

ئەژین لەســـەر وولاتیـــان
بە رەنجیـــان ، بـــە بەراتیان

بەغدا – مارتی – ١٩٥٤

# هەوەڵ دڵداری

**ئەم هەلبەستەیەم لە نامیلکەی ( گزنگی هەناو ) دا بلاو کردەوە کە لە ساڵی ( ١٩٥٧ ) دا دەر چوو ، وا بەبێ دەس کاری تیدا کردن – دوو بارە ئەیخەمەوە بەر چاوی خوێنەوارە بەرێزەکانەوە •**

لە سەر روانی داری تەمەنما
چەند ساڵ بەسەر چوو
تەنها جارێ بو ، کە هات بەسەرما
دڵداریم تووش بوو

تا بڵێی ژیان سەخت بوو ، پرر بوو
لە قۆرت ، مەشکەلە
گەنجی هان ئەدا ، بە تاوو گورر بوو
خێرا بــە پەلــە

بۆ گۆشە گیری ، بۆ بیر کردنەوە
لــــە بیر وەهـــا
فێڵ بن بۆ زیان لە بیر بردنەوە
بەستی نەبێ تیـــا !!

جوانێ سرنجی وا راکێشابووم
هەر وەك فریشـــــتە
خۆی ئەنواند ، منێك کەوا تەنیا بووم
بردمی لـــــە خشـــــتە !

بە نیگای جوانی ، پرر لە دڵداری
خەندەی سەر لێـــوی
کرداری ئەنواند ، تا بەناچاری
هـــــەستت بزێـــوی

دەنگی ناسك تر ، لە دەنگی پەری
ئاواز بوو بۆ دڵ
لە جووتی لێوی سوور هەڵ ئەوەری
زۆر سوور تر لەگوڵ

هەر گیز نەم بیستوە ، دەنگی واناسك

وا بۆ گوێچکە خۆش
وەك مۆسیقای زین ، بێ وورە تك ، تك
گیانم ئەی کرد نۆش

منیش کە هیوا داری بووم ، نەك بەد
دڵمی وا بەهەست
نیشانم ئەدا زۆر رەقتر لە بەرد
باش ئەم کرد بەربەست

چاوی واتێنووم بۆ ئاوی جوانی
ئەو هێزەی ناوی
ئەم خستە پشتی پەردەی پەنهانی
بەرامبەر چاوی

ئەم ووت : گەربێتو لە خوێندن بکرێ
لەم پایەی ئیمرۆ
بەگی دڵداری بە سەرا ببرێ
ئەبێ رەنجەرۆ

نەم زانی ئەوی قازانجی خەڵکی
بێنێتە بەر چاو

داری ئاواتی ئەوەریّ پەلــکی[1]
وەك داری بیّ ئاو

بە بیرا هەر گیز نە ئەهات کەوا
لـــە بـــۆ غەریزە

من بدۆڕێنیّ ، لـــە پێنـــاو ئەوا
بی بینم زیـــزە !!

ئاوا بـــەم جـــۆرە بە پاچی پاکی
تـــەلاری ئەمـــەل

گۆڕا بە دەشتیّ ، کاکی بە کاکی
لیّی بخوێنی قەل

لە ژێر کەلاوەی هیـــوامو تاسەی
ئومێدەواریـــــم

بیّ بەزەییانە وورد کرا کۆرپەی
هەوەڵ دڵداریم !!

کەرکووك چلە (کانوونی دووەمی - ۱۹۵۷)

(۱) پەلك - گەڵا

# بەهاری ژین

**لـه ژماره (۱۰)ی سـالی یەکەمی مانـگی نیسانی ۱۹۵۸ی گۆڤاری هیـوادا بلاو کراوەتەوە .**

با هەڵنیشێ لە رووی ئاوونگ تیشـکی خۆر
تێکەڵاو بـێ رەنگی سـەوزو رەنگی زۆر

با هەڵفرێ بولبول لەم چـڵ بۆ ئەو چـڵ
داتـە کێنێ ئاوونگی سارد لـە رووی گوڵ

جێ پێی مالآت پرر لـە ئاوی باران بـێ
بلعەی مـەررو بزنو بـەرخو کاران بـێ

ئەو ئاوازەی هیـچ کـەمانێ ، هیـچ نایێ
ئاوازی وا نـەرمو خـۆشـی لێ نایـێ

قازو قورینگ بـه قاژەو دەنگی بـه سـۆز
بێنن بۆمـان موژدەی بەهـارو نەورۆز

بـا مراوی بـه خێرابیو لەنگـه لەنگ
بێنو بچـن بشڵەقێنن گۆمـی مـەنگ

با ئـەو بەفرەی لـه لووتکه ئـەتوێتەوە
بەسەر بالای بووکی کێـو شـۆرر بێتەوە

بلەرزێنێ لاسـکی مـۆرووی ووردیلـه
لاسـکی وەنەوشـەو نەرگزو حاجیلـه

با کـەو جێگەی لووتکەی سپی بەرز بێ
هێند بخوێنێ له قاسپەی خـۆی وەڕس بێ

با وولاتـم لەمـه زیاتر جـوان بـێ
هـەموو شتێ هـۆی دڵخۆشیو ژیان بـێ

ئەگەر ئێمەی خـاوەن وولات هـەزار بین
چەوسـێنراوەی دەس بێگانەوزۆردار بـین

بە ئێمە چی جوانی سروشت ؟ هی بـەهار ؟
روونی کانی ، وورشەی گیا ، چرووی دار ؟

کام جوانی ، کام ئاواز ، کام بۆنی خۆش
دڵی هەزار لە خەم ئەکـەن فەرامۆش ؟

یا کـەی گیانی هۆزێکی رووتو برسی
جوانیو خۆشی کـەزی بەهار ئەپرسی ؟

جوانیووڵات هەستی وورد فێر کردووین
بەڵام ئـەوەی هەستی ووردی بردووین

بێگانەیـەو کـردارى ناشـیرینی
ئەو لـە کوردی گۆرریوە یاسای ژینی !

ئەو یاسایەی سـەربەستی ، شـادمانی ،
ئامانجیەتی هـەر یـەك لـە بەندەکانی !

کـەچی ئێستا یاسای ژیـان سەراسەر
تەرخانە بـۆ درزندەی لاساری گـەرر

هەر رۆژ بـە داوی پیلانێ ، تـەگبیرێ
رێگەی شـادیو سەربەستیمان ئەگیرێ[1]

بەڵام ئەوەی درێغی بـێ ، با نەیکـەن

---

(١) لە دوای یەك بوونەوەی هاشمی یەکان دانراوە.

برِرۆن لە سەر ئـــەو کردارانەی ئەیکەن

ئیمەش بـــەرەو ئاما نجمـــان ئازایانـــە
ئەرۆین ، خەبات ، یەکگرتن پیشەمانـــە

قۆناغمان دوور تریش بـێ هەر ئەیگەینێ
مـــوژدەی دوا رۆژی رەشیان ئـــەدەینێ

ئەهێنینـــە کـایـــە بـەهـــارێـکی وا
پرر لـــە شـــادیو ژیـــانو بارێکی وا

لەگەڵ بەهـــاری برسـیـەتی جیـــابێ
هـــۆی ژیانێکی پـــرر خـــۆشی تیابێ

لە ژێر سایەی ( بەهاری ژین ) گەلی کورد
بێباك بژیـــن ، شادمان ، درشتو وورد

کوردستانی جوان ماڵی کـورد بێو بەس
بەسەریـــەوە نەبێ هەرگیز بەشی کـەس

گەلی کوردی گوردیش بە بازوو و قۆڵی
خـــاك بکێڵێو کانگەی ئاڵتوون هەڵکۆڵی

کۆن تێـك بداو تازەی لەجێ دروست کا
رەنجی مەردووم تێکەڵ جوانی سروشت کا

لەگـــەڵ کـــاروانی میللەتان هــەنگاونێ
ســـوپای شکستەی دوژمنـانی راو نـــێ

ژیانی کورد هەر ئاهەنگ بێ و هەر شایی
( بەهاری ژیـــن ) هەرگیز نەیێ کۆتایی

کەرکوك ـ مارتی ـ ١٩٥٨



# سکالایەك
## لەکوردستانی ئەودیوەوە

**لە خەباتی ژمارە (٨٨)ی رۆژی دوو شەممەی ( ٢ی تشرینی دووەم ١٩٥٩ ) ، سالی یەکەمدا بلاو کراوەتەوە • گۆڤاری (شەفەق) یش لە (خەبات) وەری گرتوو لە بە شی ( گەشتی خوێندەواری ) دا بلاوی کردەوە •**

کـــوردم
یانی ! ئازاو کوردم
ئیمپریالزمی دوژمنم
دابەشی کردوە وەتەنم
تاکوو بەراتی کوردستان
زۆر بـــە ئاســـان
بچێتە باخەلی ئـــەوان



منیش دەربە دەر بە قاچاخ !!

ئەبردم سنووری ( نەبووی ) یلساخ !!
لە کوردســـــتان
ئەوەی بەستراوە بە ئێران ،
ئەوەی نان لێی دەسناکەوێ
کانگەی بەراتیشە ئەوێ !!
بەڵام نان لێی دەسناکەوێ
لە مەهاباد :
پایتەختی کۆماری ئازاد
خزمو خوێشم بەجێ دێڵم
قوڕاوو بەفر ئەشێلم
بەرەو گەرمێن دێم بۆ نانێ
ئەبێ ، نابێ ، خوا ئەیزانێ
لە گەرمێنیش هەر برسیمە ،
نانی ژەمێ چیە ، نیمە .
جار بۆیاخچیم
جار جار خەریکی حەماڵیم .
لەم ئیشانەش ،
تا لەم ئیشە بچووکانەش ،

چیم دەسکەوێ ، زۆر بێ یاکەم ،
سوپاسی خوداوەند ئەکەم .
بەمەش رازیم ، لێم ناگەڕێن
کە پۆلیس ئەمبینن ئەڵێن :
هەتیو کوانــــێ ؟
کوانێ پەساپۆرتت کوانێ ؟
تۆتیرانیـــت !!
من ئەوەندەم دەس ناکەوێ
کەپۆلیس لە منیان ئەوێ
بۆئەوەی بهێڵن بژیم
لەو خاکەی لێی بێگانە نیم



ئیشکەرێکی گورجو گۆڵم
بە تەنیا شاخێ ئەکۆڵـــم
کۆڵم ، قۆڵم ، شانم ، بازووم
هەر لە ئیشدان ، ماندووم ، ماندووم
لەگەڵ ئەمەشدا کوڵـــۆڵـــم .
ئەزانم بۆ لــــەم ئازارەم

هاوین و زستان ئاوارەم
لە گەرمێنی بۆ کوێستانێ



بۆمـــن ، بۆمـــن
بۆمن دەسناکەوێ هەرزن
بەڵام دوژمـــن
لەبەر زۆر خەوتـــن و خواردن
لـــە رەنجی مـــن
لـــە خوێنی مـــن
ئاوساوە وەك دەعبای گۆشتن •



زۆر باش ئەزانم دوژمنـــە
ئەو هۆی نزمی ژینی منـــە
یەکێك هەمیشە برسی یە
کەرەنجی خۆی بۆ خۆی نی یە •



با ئەوان هەر خوێنم بمژن
هاو وولاتیانم با بکوژن
با کوردستان بە خوێن سوور کەن

بۆ جەنگ با هەر لوورە لوور کەن ،
سوپای بێ ئەژمار با بێنن
مەرگ بچێنن
کچ‌و ژنان بگرێنن .
ئەم کارانـــە :
ئەم کارە نا هەموارانە
خۆیان ئەخـــات
زووتر بەرەو گۆرر ئەیان بات
نیشتمانەکەم ، کوردستان
سەختی شاخ‌و بەفری زستان
ئازاو چالاکی فێرکردووم
فێری کردووم کە ئازابم
بـــە توانـــابم
دەنـــا ...... نابم
چونکە وام بۆیە نەمردووم .
یەکێ وابێ چۆن ئەترسێ
لە مافی خۆی چۆنناپرسێ ؟
من کەوا دڵنیـــام لەوە

رۆژ هەڵاتن لە دوایِ شەوە
زۆر دڵنیـــام ،
دڵ پرر لە ژین ، پرر لە هیوام ،
بێ گومانـــم ،
باش ئـــەزانم :
کاتی رزگاری من هەر دێ
ئەو ساکەش سەدقەڵو بەردێ •

کەرکوك
تشرینی یەکەمی ١٩٥٩

# بۆ دوژمنی گەوج

چۆن لە ڕێگەی سەندنی مافی گەلی کورد لا ئەدەم؟
چۆن بەررە بە خوێنی سووری ڕۆڵەکانی دا ئەدەم؟!

چۆن لـــــە ڕێی ڕاگرتنی کورسی شلۆقی تێوەدا
بەرژەوەندی (١٦) ملیۆن نەفسی کورد بەربا ئەدەم

قەت ئەمانە ئیشی مـن نین مـــن هەمیشە تا ئەژیم
دەرسی هەڵمەت ، تۆڵە سەندن ، بـۆ نەوەی کورد
دا ئەدەم

گەوجە ! تازە کورد بـــە هیچ کەس نافرۆشرێ‌و
ناکـــرێ
چۆن منیش وەك تۆی گەوج ، خەنجەر لە فەردەی
کائـــەدەم

ئەمری »، یا خود بەختیاری »، هەر بەشی تێکۆشەنە
بۆیە وا پشتم بە هێزی میللەتو بروا ئەدەم

یا هەڤاڵان چەپکە گوڵ دێنن لەبۆ سەر گۆررەکەم
یا خو توند باوەش لە بووکە جوانەکەی ئاڵا ئەدەم

من سڵاوێکی هەزارو رووتەنێکم دەس کەوێ
سەد دراوی تۆ و کورسی تۆی لە پێناوا ئەدەم

گرتووخانەی تسن - کەرکووك ــ
تشرینی یەکەمی ـ ١٩٦١

# پێشمەرگەی کوردستان

من پێشمەرگەم ، پێشمەرگە
لەسەر مانی کورد بەڵگەم

بەڵگەم بۆئەوە کە کورد
بۆ دوژمن نابێ بە پرد

زۆری کـــاری تێ ناکـــا
سەر بۆ دوژمن شۆرر ناکا

تاڵی‌و سوێری ئەچێژێ
تا بوونی بپارێزی

لای وایە ماف ئەسەنرێ
بۆیە بۆ ژیان ئەمرێ

سەر بەرزیو بەختیاری
لە ژێر سایەی رزگاری

بە هەر نرخێ بێ ئەکرێ
ئەکوژێ ، ئەبرژێ ، بۆێ ئەمرێ

لەسەر راستی ئەمانە
من بەڵگەمو نیشانە

---

دوژمنانی کوردستان
هێرشیان هێنا ویستیان

گەلەکەم بفەوتێنن
دوایی بە بوونی بێنن

منیش لەم سەدەیەدا
کە خەڵك بو ( مەریخ ) ئەرروا

گەلان لە مانگی دەسکرد
دەوری زەمین یان پرر کرد

له لام شەرمەو مخابن
سەر شۆرر بکەم بۆ دوژمن

دەستە وەستان بینم
ئاگر بەردەنە ژینم

خراپە کاران بکوژن
بە کۆمەڵ منداڵو ژن

خوێن بەسەر ریشی چەرمگ
دا بێتە خوارێ ، تلك ، تلك

ئەم خاكو هەواو ئاوە
پشتاو پشتمی لێ ژیاوە

ووڵاتی وا خۆشەویست
وێران بکەن ، بست بە بست

دێ بە سەر خەڵکی چاکی
دا وێران بکەن پاکی

ئاگر دەن خەرمانو رەز
تالآن کەن ناو ماڵو پەز

واجبو شەرەف ، ئەمەك
دەستیان پیٚ دامە چەك

پاڵیان پیٚوە نام کەوا
بۆ مافی ( ژین )ی رەوا

پۆ بەرزی نیشتمانم
بەخت کەم ، ماڵو گیانم

---

دەستو دەمو داویٚن پاك
لە هەر چی ترسە بیٚ باك

تا تووانام ئەکا برر
پیٚشمەرگەمەو هیچی تر

گویٚ رایەڵو هوشیارم
چاكو خراپ ئاگادارم

ژیانم سەر تا پائیش بێ
لەم جێ راکەم بۆئەو جێ

لەم فرمان بۆ ئەو فرمان
بە چلەی هاوین یا زستان

برسی و رووت و پێخواس بم
لەبەر بێ خەوی گاس بم

تاکوو نووزەم تیا مابێ
گیانم لە لەشما مابێ

بەرامبەر نیشتمانم
خۆم بە قەرزار ئەزانم

هەتاکوو نەبمە قوربان
کوردو خاکی کوردستان

لە لام شەرمە باس بکەم
بە خۆم بڵێم پێشمەرگەم

چونکە قسەو کردەوە
نابێ لێك جوێ بنەوە

---

ماڵو کەسم پەرێشان
هەموو بمرن لە برسان

لەســـەر ڕێــگا ســـواڵ کەن
بۆیان ، ئەم ماڵ ، ئەو ماڵ کەن

تا کوو لە جەورو ستەم
کوردستان ڕزگار نەکەم

میللەتم ئازاد نەبێ
بەختیارو شاد نەبێ

سەر تا سەری ژیانی
نە بێتە کامەرانی

بەقەد موویەك زۆرو کەم
لەم ڕێگایە لا نادەم

چونکە ئەمە بۆ کوردە
لە رێی درشتو وردە

هەتا ئەگەم بەئاوات
چوستو رێك ئەکەم خەبات

---

جا هەتاکوو ئەو رۆژە
وەکوو گوڵە بەرۆژە

روو ئەکەمە ئەو جێیە
خەباتی سەختی لێیە

( یان کوردستان یا نەمان )
ئەکەم بە ویردی زمان

- کوردستان ـ ١٩٦٥

# وه رامێك

ئەمەن زۆریت لە من کردووە بە بیانوو
وەك یەکێ بم لە بن ســالآندا مردوو !!

پشت چەماوەی زەمانە بم ، دار لە دەس
هیوا برراو ، تەنگە نەفەس ، بێ مەبەس

ها ئیمرۆ ها بەیانی رەت بم ، بمرم
تۆش جێ بێلم ، بۆ پاسەوانی قەبرم

تۆی وا ناسك ، تۆی ئەمەندە شۆخو شەنگ
تاکوو مردن بووەش بەی لە گۆررو سەنگ !!

یادی سامناك ، گۆرریش لە یاد سامناك تر
ئەم دوو سامە بۆ عومرت ببنــە ئاگـــر

نەخێر سەهووی ، من خۆم بەلاو ئەزانم،
شایستەی ئازادرێکی نەو جەوانم

هەموو گیانم لاوێتیو جۆشو سۆزە
لە ناو دڵما ( هەمیشە هەر نەورۆز )ە

زەماوەندە ، هەڵپەرکێ‌یە ، شادی‌یە
ژیانە ، تێکۆشانە ، ئازادی یە

گۆرانی‌یە ، مۆسیقایە ، سەمایە
هەزارویەك بەزمی تری تیایە !!

بە لەنجەیێ ، بەنیگایێ ، بە نازێ
بە دوگمەیێ کە لە سەر سنگ بترازێ !!!

بە سرنجێ ، پێکەنینێ ، ، بە رەوتێ
ئاژاوە نا !! قیامەتی ئەکەوتێ !!

خوێنی ئەبێ بە شالاوو بە ئاگر
چ ئاگرێ ؟! خوایە نەی بینێ ( کافر ! )،

بۆ گوشینی ، پەنجەیێ ، قۆڵێ ، شانێ
دەس داهێنان ، بە قژی نەرمی ، جوانێ !!

بۆ ماچی گۆنایێ ، گەردنێ ، ملێ
وەك مەنجەڵی ( نازانم چی ! ) ئەکوڵێ

کام باڵەخانەی بەرزە ، لەم سەر ئەرزە
هیوای دڵم بەرز ترە لەو بەرزە

من کە پەروەردەی هەوڵو تێکۆشانم
ئیشێ نیە بە زەحمەتی بزانم

هیوای بەرز ، هـــەوڵو زەحمەتی ئـەوێ
چوونە ( بەهەشت !! ) تەقواو رەحمەتی ئەوێ !!

من ئەم لاوەم ، من ئەم کووڕەم ، ئەبینی
هەرگیـــز داماوی نازانێ لـــە ژینـ-ی

بەڵام ئەگەر بڵێی مناڵ ، مناڵ نیم !!
هەرزەکاری سەر شەقامو بەر ماڵ نیم !!

وەنەوشەکەی ( باخی خۆمان !! ) ئەی شەوبۆ
هەندێ بەینی هەیە عومری منو تۆ

جیاوازی عومر ، ئەگەر هەندێ بێ ، خێرە
لە دوو ( وەرد ) ا ، شۆی کۆن بە پیتو بێرە !!

دوور بینی یە ، تەحەمموله ، ژیری یە
واتێ نەگەی بێ تاقەتی و پیری یە !!

ئەگەر ئەم شعرە ببینێ پیاوی ژیر
(حەبیبە) و (تۆ) و (نالی) و (من) ی دێتەبیر !!

کە تەنیا ئیلهامی تۆیە ، وەحی تۆ
هەستی منە ، بە شێکە لە رۆحی تۆ

بێ تۆ ، کەی من شعری وهام داناوە ؟
کەی لەم مەیدانە وولاخم تاو داوە ؟

سوێند ئەخۆم بەم سروشتە ، بەو ( خوا !! ) یە
ئەمەی ووتم ، ئەوەنێ یە لە دلمایە

ئەوەندەی من ووتومە ، سەد ئەوەندە
لە ناخی دڵدا ماوە ، تیایا بەندە

تازانم جۆن پەردەی ( کپی ) دڵ بدررم
وەك ئەمەوی هەستی دەروون دەر ببرم

کەی ئەمانە شعرو هەستی دەرونن ؟
بە نیسبەت ئەو وەکوو نەبوونو بوونن

بەڵام چی بکەم ؟ هەر ئەمەندەم لە دەس دێ
کەم کاروان نە مردوون لە نیوەی رێ !!

بەرامبەر تۆ ، هەر چی بڵێم ، هەر کەمە
دەر نابرێ ئەو خۆشەویستی‌یەی هەمە

بە رامبەر بەم دڵدارە بەم دڵپاکـــــە
کە لە راستی‌و خۆشەویستی دا تاکە

بە رامبەر بەم ( شاعر !! ) ە ئەی ( حەبیبە ! )
روو خۆش و دڵ بەرەحم‌و بەزەیی‌بە !!

بەغدا ـ ئابی ـ ١٩٦٧

# داوای نامه

کاغەزم بۆ بنووســـە
چیم پێ ئەڵێی پێم بڵێ!!
ئەبێ چی بێ ئا ئەمەی
بۆمی بنێرێ ... گوڵێ ؟!

ئەوەی بۆمن مەرامە
تەنیا نامەیە،، نامە
قسەی ناوی رەقیش بێ
هەر وەك هی خۆش بە تامە !!

لە نامە جوێنم پێ بە
شەربەت نا،، خوێنم پێ بە !!

کانی مەبە ، هێمن ، روون
لافاوی چۆمو زێ بە !!

گەردەلوولی سەر رێ بە !!
شەستیری لەسەر پێ بە !!
تێكو لوولم بشكێنە
هەزاران تیرم لێ بە !!

پەردەی نامەی ئاسایی و
شەرمو ریز گرتن بدڕە !!
لە نامە بە یەك ووشە
جەرگو دڵی من بدڕە !!
چی ئەنووسی بنووسە
ئەوەی ووتیشی ( كفر )ە !!
هیوام بەو فەرموودە یە
لە دوای ( عوسر ) هەر ( یسر )ە !!

خەتو قسەت ببینم

چریەی خۆشت دێتە گوێم !!
بە مانە وا ئەزانم
کەوا زۆر نزیکی لێـم !!

دەنگی ناسکو نەرمت
چاوی بە نازو شەرمت
کە بەشێکن لە ژینم
هەر دوو ، ئەبیەم ، ئەبینم !!

خەریك ئەبم دەس بێنم
بە سەر ملو گەردنتا !!
نوقورچ بگرم لە رانو
جووتە گۆنای خرین تا !!

بچمە ناو دەریای چاوت
پیرۆزەی شین دەربێنم
نهێنی دڵت هەموو
بە چاوت بدرکێنم !!

دەس بکەم بە ئاخافتن
بە پێکەنین ، گاڵتەو گەپ
بت خافڵێنم ، ماچ بدزم
جارێ لای راست ، یەك لای چەپ
پشتو رانت دا بگرم
بە زللەی سەبر ، شەپ شەپ
لە شانو سنگت بگرم
گاز لە دوای گاز ( قەپ بای قەپ ) !!

ئۆباڵی من بە ئەستۆت
بێ بەشم مەکە ، ئەی گوڵ
لە نامە ، با نامە بێ
خوێناو بتکێنێ لە دڵ !!
ئۆ باڵی خوێنرێژی تۆ
من ، هەر خۆم ئەیگرمە مل
چونکە ئەزانم ئەی گوڵ
نەبووە گوڵ ، بە بێ چقڵ !!

بەغدا ـ ئەیلوولی ـ ١٩٦٧

# قه‌ڵای ناوقه‌ڵات

له ناوه‌ندی ئه‌و قه‌ڵاته
که‌وا یادگارو ره‌مزی
قاره‌مانی رۆژ هه‌ڵاته
گزنفۆن[1] له به‌ری به‌زی

نازدارێکی تێدا هه‌یه
سه‌ر چاوه‌ی خۆشی‌و ئاواته
ناگیرێ ، سرکه ئاسکه‌یه
به گیر نایه ، وه‌ك قه‌ڵاته !!

---

(١) گزنفۆن : سه‌ر کرده‌یه‌کی یۆنانی بوو له گه‌ڕرانه‌وه‌یدا له رۆژ هه‌ڵات له ده‌ورو به‌ری (٤٠٠ سال پ٠م) هه‌ولی داگیر کردنی هه‌ولێری‌دا به‌ڵام بۆی داگیر نه‌کرا ـ خاوه‌نی کتێبی ( ئه‌ناباسیس ) ٠

بەڵێ خۆشم ئەوێ ، بەڵێ
چەندی بڵێن خۆشم ئەوێ
گیانم ئەڵێ ، دڵم ئەڵێ :
خوێنم ئەڵێ : « هەر ئەمەوێ » !!

خزمو دۆست هەموو پێم ئەڵێن :
بۆ ئەم ( قەڵای ناو قەڵاتە )
مەچوو « مەڕرۆ » مەکەوە شوێن
ئەمە ڕێی هاتو نەهاتە !!

چیرۆکی کۆنت دێتە بیر
جادووگەر دەبوون بە ئاسـك
ڕاو کەریان ئەبرد بە تەگبیر
هەرداو هەردو باسکەو باسك ؟!

ئەمەش بە دیمەن ئاسـکەیە
سحربازە ، جادوو گـەرە
لە دوا ڕویشتنی ( وەی )ە
ئازارە ، زیـانە ، شـەڕە

نهێنیت لای بوو ، درکـــانی !!

تاتۆی خـسته دەس وەك نێچیر

ئێستاش بەفێڵ ، بە شەیتانی

خۆی ئەنوێنی پـەسـتو دڵگیر

تۆ کوژراوی دەسـتی ئەوی

یا ئەو کوشتەی دەستی تۆیە

( پەستە !! ) تۆی داوە لە زەوی

مەسەلەی ( دزومـاڵ خۆ ) یە !!

بەڵام ئەی هەڵبژاردەی خۆم

ئەم ریگایەم گرتوەو ئەگرم

تۆش بۆ من نەبی من بۆ تۆم

ریێی سەخت خۆشە لێشی بمرم !!

خزمو دۆسـت دەك بێ بەلا بن

بۆ هێندە دۆسـتی کۆڵـدانن ؟!

کەی دێ وەك من دڵنیـابن

لا یان دیـار بێو بـزانن

که ئەم قەڵا سەخت و بەرزە
ئەو قەڵاتە سرك و جوانە
ئەژنۆی من نا هێنێتە لەرزە
سەر کەوتنیان بۆم ئاسانە !!

چونکە من کوردم لەم خاکەم
یەکێکیشم لەو خێزانە
سڵ لە هیچ کامێکیان ناکەم
خۆ ( گەزنفۆن ) نیم ، بێگانە !!

ئەم توندی و تیژی یەی ئەی بینن
شۆخی و مەکرە ، نازە ، رازە
خۆشەویستی پێ ئەچێنن !!
بۆری ژین دەرسە ، رێبازە !!

بۆیە بە زەحمەت دێتە دەس
زیاتر خۆشەویست بێ
تاکوو لە لەش ماوە نەفەس
هەمیشە جێی ناو مشت بێ

هیواو هێزی دڵداریم هەس
ئاواتم بە دوور نازانم
ئەم دوو چەکەم بەرەو مەبەس
باڵ بشتە لە تێکۆشانم

هیوا سەختی ئاسان ئەکا
دڵداری ئەزیەت وون ئە کا
هیوا ( مردن) بە ( مان ) ئەکا
دڵداری ( بێستوون ) کون ئەکا

قسەی هاتو نەهاتی کۆن
نەهێشتی ئەگرمە مل
وەکوو ئاواتی ( گەزنفۆن )
لەبن قەڵا ئەنێمە گڵ !!

بەغدا – تشرین یەکەمی – ١٩٦٧

# پێشمەرگەی مرۆڤایەتی

قارەمانی شۆڕشگێڕان ، مایەی سەربەرزی ! گیڤارا
بۆ میللەتی ئەرجەنتینو خەڵکی سەر ئەرزی ! گیڤارا

لات شەرم بوو،تۆ هەبیتو وولاتیکیش هەبێ ژیر دەس.
نەتەوەیە بەش خوراو بێ،رەنج خوراوبێ تاکەیەك کەس.

ئەتەویست ببی بە سەد کەس، بە هەزار کەس ،
بە ملیۆن کەس
هەر یەکەت بچێتە شوێنێ ، بۆ شۆڕش هەڵگیرسانو
بەس

لە پاش سەر کەوتن لەو شوێنە ، بێ شۆڕش نەژی ،.
نەبی گیر
ئەگەر بت کەن بەپێشەواش ، نەوەك هەر بت کەن
بە وەزیر

ئەم ئاواتەت بە ئاسایی نە هاتە دیی ، هەر بۆیە بوو
لەش‌و جەستـەی ، دەردەدارت ، لە مـەیدانا نەما ،
دەر چوو

ئەزانن بۆ لەشی جێ‌ما ؟ بە نیسبەت بەرزیی باوەڕی
بە نیسبەت بەرزیی ئامانجی تەحەممولی نەبوو ،
وەرێ !!

ئیستا لە هەر وولاتێکی دوا کەوتوو گیڤارایە
جاڕی شۆڕش کردن ئەدا ، ئەم جاڕ دانـــــە
دوایی نایە

تا لە ژێر پێی ئیمپریالیزم‌و زۆرداران‌و خوێنمژان
هەموو جیهان نەبێ بە ئاگرو نەهێنرێتە هەژان

تا میللەتان ،لە چاڵ نەنێن لاشەی ئیستعماری چەپەڵ
تا کرێکارو رەنجبەران نەژین شـادو تێرو تەسەل

بە شۆڕشگێڕی‌و نەبەردی گەیاندی‌یە نیهایەتی
کالآی باڵایە پێی بلێن پێشمەرگەی مرۆڤایەتی

بیزانی‌بایە چەند برسی‌و چەند بەش خـــوراوین ،

ئیمەی کورد
بی گومانم لە هەر کوێ‌با ، هاوارێکی بۆمان ئەکرد
بۆ بیرو باوەڕی وا پاك ، بو ئامانج و بۆ گیانی (خی)ه
مردن‌و نەمان هەرنی‌یە ، مردنی‌چی ؟ نەمانی چی ؟
تا هەموو مافێکی خوراو نە گاتەوە دەس خاوەنی
گیڤارا هەر شۆڕش ئەکاو هەر درێژ ئەبێ تەمەنی
لە هەر قوژبنێکی جیهان ، شۆڕشگێڕی باسی بکرێ
گیڤارا یەکەمین کەسە لەم مەیدانە ناوی ببرێ
هەر گوللەیە ئیمپریالیست بپێکێ هی گیڤارایە
هەر هاوارێ لە رووی بکرێ دەنگ‌و نرکەی ئەوی
تیایە !!

بەغدا – تشرینی یەکەمی – ١٩٦٧

# لەگەڵ ئاوێنەدا

ئاوێنەکەم گێلۆکەیە
ئەڵێی نازانێ من کچم
ئەو لەبەر دەم من لا نەچێ !!
چۆن من لەبەر ئەو لا بچم ؟!

خۆ سەعاتیش ماڵی رمێ
هەر وەك بڵێی باڵی هەیە
چەند لەبەر دەمی ئەوەستم
لام وایە ئێستاو تازەیە !!

ووردە هەڵیکم دەس کەوێ
وا ئەکەم ئەچمە بەر دەمی

نامەوێ گومانم هەبێ
بۆ نارێکی ، یا بۆ کەمی !؟

سەیری هەموو لەشم ئەکەم
پشتی سەرو پشتی ملم
بەرو پشتو هەر دوو تەنشت
تا ئەگاتە قاچو قولم !!

ئەبێ هەموو جێگایەکم
وەك گەرەکمە ، رێكو پێك بێ
بۆ مەست کردنی لاوەکەم
هەر دیتنێکم ، سەد پێك بێ !!

نازانم من واجوانم
یا خەلك ریایی ئەکەن ؟
هێندە جوانیم هەڵ ئەدەن
عەقلم لەخۆ بایی ئەکەن !![1]

---

(١) لە خۆ بایی بوون — (غروور بوون)

دۆستی دڵسۆز ، ئاوێنەیە !!
چونکە هەر بەراستیو بەبێ
کەمو زیادی ، پێم ئەڵێ
ئەگەر هەر عەیبێکم هەبێ !!

منیش ئەو عەیبە نا هێڵم
خۆم بێ عەیبو بۆن خۆش ئەکەم
بە جوانیو نازو بۆن خۆشی
دڵدارەکەم بێ هۆش ئەکەم !!

چەند حەز ئەکەم بەژنو باڵاو
سنگو مەمکم قیتو جوان بێ
خۆشە !! هەر ئەندامێکی لەش
بۆ چاوی لاوان نیشان بێ !!

کاتێ بەرێکی ئەچمە لای
تیرم لە جەرگی را ئەچێ !!
چاوی بە نەوعێ ئەگۆڕرێ !!
دەمو لێوی تامی ئەچێ !!

وەك مناڵ دێتە بەر چاوم
ئەو کاتە هێندەم خۆش ئەوێ
حەز دەکەم زۆری بدوێنم
دەستی لەمل کەم ، هەر لەوێ !!

کە دەی ئاخێوم ئەشێوێ
دەم تێکەڵاو ، شپرزەیە
ئەم سەرکەوتنە گەورەیەم
زۆربەی بە هۆی ئاوێنەیە !!

دایكو باوکیشم پێم ئەڵێن :
« هێندە لەبەر دەم ئاوێنە ،
رامەوەستە ، خۆ رێك مەخە ،
خۆ بامەدە ، خۆمەنوێنە !! »

بەغدا ـ کانوونی یەکەمی ـ ١٩٦٧

# هاتنی یار

ووتیان : « پاش رۆژ ئاوا بوون ،
وا رۆژێکی تر هەڵات » »
وەك ئاوررم دایەوە
دڵدارەکەم بوو ئەهات !

یار روو لە هەر شوێنێ کا
رۆژ هەڵدێ ، گوڵ دەبارێ
زستانی رەش ئەگۆررێ
بە سەیرانگای بەهارێ !!

بە سەر چاوانم هاتی
ئەی رۆژو دڵو گوڵم

ئەی دەرمانو ئارامی
دەردو ئازارو کوڵم

چیت لەبەر پێ سەر بڕڕم ؟
چیت بکەم بە قوربانی ؟
چۆنت پێشوازی بکەم ؟
بە ئاهەنگ!؟
بە گۆرانی !؟

لە کام جێگەت دابنێم ؟
ئەی هیواو تینو تاوم ؟
لەسەر سەرم ؟
لە ناو دڵ ؟
لە ناو بیلبیلەی چاوم !؟

گەر دڵی خۆم دەربێنم
بۆتی بکەم بە خواردن
هێشتا کەمە ، بە قوربان
خۆشە لەبەر تۆ مردن !!

لێم ببورە ، هەڵەم کرد
بۆ تۆ کەمن ئەمانە
کەی پێشوازیو جێگەی تۆ
وەك هی بەرەی ئینسانە ..!؟

بەڵام داخی گرانم
هەر ئەمانە شك ئەبەم ..!!
لە تاو دەردی نەبوونی
مەگەر هەر دەس لە دەس بەم !!

نرخی تۆ من ئەزانم
وا لە دڵو دەروونم
لە سینەم ، پاسەوانی
سەد گەنجینەی قاڕوونم !!

بەغدا ـ کانوونی دووەمی ـ ۱۹٦۸

# درۆزن

درۆ ئەکەی خۆشت ئەوێم
دڵـــت لەو جێیە وا لە وێم

ســە ودای منی ، شەیدای منی
هەمیشــە بە دڵ لای منی

لـــەم جیهـانە فراوانە
لـەم هەموو شـــتە جـوانانە

لـەم ژیانە ، لەم بە هەشـتە
تەنیـا خەیاڵی من بەشتە !!

لە دووریم ژیانـت تـاڵە
ســەر لێ شێواو ، زمانت لاڵـە

ئاگــاو هۆشــت لە خۆ نی‌یە
زەینت لە یەك جێ کۆ نی‌یە

بە چـاو ئەروانی‌و نابینی
نزیك نەبینی ، دوور بینـی

بە مـانی من شــادمانی
خۆشـیم بە هی خۆت ئەزانی

هەر کارەساتێ روو بـدا
تۆ شـێواوی ، دەستەو دوعا !

هـــەزار حیسابم بۆ ئەکــــەی
سەد جاری ( زەرب) و(کۆ) ئەکەی

خوایە ئەوی تێـــدا نەبێ
پێغـەمبەر ( وابێ ) ، ( وانەبێ !! )

گەر یەکێ لات ناوم بەرێ
گوێت شـــل ئەکەی بۆخەبەرێ

هەموو لە شت ئەبێ بە گوێ
ئەبێ چی لێ نەهاتبێ !!؟

باش مەرگی ئەو من چۆن بژیم ؟
بۆ چی بژیم ؟ بێ ئەو منچیم ؟

بۆ دەستو پەنجەی ئەو لاوە
ئەم سنگو مەمکەم داناوە

لەو ساوە بن یان داناوە
دەسی کەسیان لێ نەدراوە !!

قژم بۆ ئەو هێشتۆتەوە
بۆسەر ئەژنۆم شۆرر بۆتەوە

رۆژێ ئەم چاوە گەشانە
ئەو نەبینێ پەرێشانە

ئەم دوو گۆنایە ، دوو لێوە
جێگەی مژی ئەویان پێوە !!

کێ ئەتوانێ وەك ئەو بمژێ ؟
ئارەزووی دەروونم بکـوژێ ؟

ئەم لەشـو لارە نازدارە
ئەزار نەدرێ ، بە ئـازارە !!

وا خۆشە هەر دەم بیشێلێ
ئازام بی ئازار نە هێڵـێ !!

کـام گـوڵ ئەگـرێ بە دەستەوە
من بـۆن بەکـار دێنـم لەوە

ئەو رەنگـی سـووری خۆشئەوێ
بۆیە سـوورن کـراسو کـەوێ

چەند خۆشە دەس لەملانی کەم
چیم هەیە بە قوربانی کـەم

چـەندم لا خۆشە کـتو مت
لە مـاڵ دای بنێـم وەکووت بوت !!

با هەرزەو سادەو منال بم
حەز دەکەم بە سەریا زاڵ بم

هەر دەم لەگەڵ ئەو لە ماڵ بم
ئەو ( بوکۆکە ) و من منال بم

من چۆن حەز دەکەم ئەو وابێ
بە ئارەزووی من بالاّ بێ

تا لەم بیرو خەیاڵانە
مێشکت خاڵی نابێ ، گیانە

تا فێری دڵداریت کردم
دڵو هۆشت لە دەس بردم

هەموو ئازای لە شت دەم بوو
هەزار ئیشارەت لا کەم بوو

پەروانەی چوار دەوری من بووی
تەنیا جووڵەو نەسرەوتن بووی !!

ئەوەندەت سرنج راکێشـــام
لێت شـێواندم ، دونیاو رێـگام

بە پێکەنین ، بە عیشـوەو ناز
لە منی سادەت وون کرد ڕێباز !!

تا خۆشەویستیت خستمە دڵ
داوی دڵـداریت کردمە مـــل

وات ئەزانی لەم دونیـایە
تەنیـــا منی لاوی تیـایە

هەموو ئافرەت بە تەمای بن
بە دڵو بە گیـان و هەست لای بن

ئەبێ تەنیـا هەر بۆ تـۆ بێ
بەرەی ئافرەت رەنجـە ڕۆ بێ !!

بۆیە ئەوەنـدە سـادە بودی
بۆ هەموو شـت ئامـادە بودی

ئێستاکەش دڵنیـــای لـەوە
کـە دەیسـم لێت نابێتـەوە

چـەندی سـەر بەرەو سەر بێنم
ناتوانم وازت لـــێ بێـنم !!

بۆیە نازم لەســەر ئەکـەی
دوور بە دوور خۆم نیشان ئەدەی

جـار جـارە سـادە ، وەك پەری
بە بەر دەمـمـــا تێ ئەپەڕری!!

هەر وەکوو تۆی جـاران نەبی
مامۆسـتای دڵـداران نەبی

کەچی دڵـت پڕر لە زامـە
هەر هی منە ، هـەردەم لامـە !!

بەڵام چـــاوت هەر راست گۆیە
ئاوێنەی دەروونی تـۆیە

بەبێ پەردە بە ئاشکرا
هەستی بە جۆشت دەر دەخا !!

چۆن رۆژو هەتاو دەبینم
واش هەستتی لە ناو دەبینم

بەڵام شتێ پەستی کردووم
ئارام وهۆش ، هەستی بردووم

نازانم چۆن‌دەر بەستت کەم
یت گرم بە ماچ مەستت کەم

چۆرر برر کەم شەهدی ئەو لێوە
حی ئەو جووتە گۆناو سێوە

نگوشم ، بمژم ، هەڵبپشێوم
ئەو لە شەت • بە دەستو لێوم

لەسەر سنگ‌و لێوو گەردن
دەم هەڵنەگرم هەتا مردن !!

ئێستاکەش کە ئەم هەڵبەستە
ئەبینی ، وا لەبەر دەستە

بە ووردی ئەی خوێنیتەوە
لە مانای وورد ئەبیتەوە

بە خۆت ئەڵێی ئەو کابرایە
ئەڵێی لە ناو دڵم دایە

قسەی دڵم هەموو ئەڵێ
بەڵێ ، خۆشم ئەوێی ، بەڵێ

بەغدا – کانوونی دووەمی – ١٩٦٨

# نەگۆڕ

گەلێ سەختم
پوختو نەختم
لەسەر مانو نەگۆڕانم
زۆر زۆر دڵنیاو بە جەختم

---

بە بیر کردنەوەو زمانم
بە عادەتو بە ئامانجم
بە هیواو هەستو مەبەستم
کوردم • ئەمە باش ئەزانم
هەردەم کوردم
بەڵگەی سەختی نەگۆڕانم

رۆژ لە رۆژ هەڵات ئاوابێ
لە رۆژ ئاوا هەڵبێتەوە
بە پێچەوانەی ئێستا ، مانگ
لە ئاسمانا بخولێتەوە
مەردووم هەمووی
هەر چوار رەنگی راست بێتەوە
ئەو راستی‌یە کە من کوردم
لە مێشکی من ناسڕێتەوە !!

---

هەر کەس بیەوێ وا نەبم
منی کورد بە بێگانە بم !!
تا خاوەنی :ـ
ئەم دایکە میهرەبانە بم
ئەم ئەشکەوت وکێوانەبم
هی ئەم بێشەو لانانە بم
پێویستە من
گۆڕر هەڵکەنی
ئامانجی ئەو کەسانە بم

لە هەر کـــاتێ
دوژمن تەنگی پێ هەڵچنیم
ڕەنگی مەترسی‌و لە ناو چوون
لێ بات‌و ئیشارەم باتێ
ئەدەمە ئەم کەژو کێوە
نەك دوژمن خـۆی
دەنگی گوالەشی نامگاتێ
تا لەو کاتەش
لەهیوای دوژمن گۆرر کردن
دڵــم خاڵی نابێ ســاتێ

---

دایکم لە باوەشم ئەگرێ
ئەو گوللەی دوژمن تێم ئەگرێ
ئەو باوەشە سەختە نابررێ
منیش بۆ ژیان هەوڵ ئەدەم
یا داری هیوام بەر ئەگرێ
چەوسانەوە ڕەگی ئەبررێ
کورد ئازار دان دۆڵی ئەدڕێ

یا خو ئەمرم

چەند پیرۆزە

بوانســـانێ

لەبن شـــاخێ

لە ئەشکەوتێ

لە پێناو ماف‌و سەربەستی

لە باوەش دایکی خۆی بمرێ

خۆ ئەو کاتە ، هـەر هیچ‌نەبێ

بە سەر بەرزی

ئەو بستە پاک‌و پیرۆزەم

لەم کوردستانە پێ‌ئەبرزێ !!

بەغدا – شوباتی – ١٩٦٨

# ناوەڕۆك


| | لاپەڕە |
|---|---|
| ئاگرو گوڵ پێشکەشە | ٣ |
| سەرەتا | ٤ |
| یەك دوو قسە | ١٨ |
| کوردو ئاشتی | ٢٢ |
| کۆتر | ٢٦ |
| هەوەڵ دڵداری | ٣٠ |
| بەهاری ژین | ٣٥ |
| سکاڵایەك لە کوردستانی ئەو دیوەوە | ٤١ |
| بۆ دوژمنی گەوج | ٤٨ |
| پێشمەرگەی کوردستان | ٥١ |
| ودرامێك | ٥٩ |
| داوای نامە | ٦٥ |
| قەڵاتی ناو قەڵات | ٧٠ |
| پێشمەرگەی مرۆڤایەتی | ٧٦ |
| لەگەڵ ئاوێنەدا | ٨٠ |
| هاتنی یار | ٨٥ |
| درۆزن | ٨٩ |
| نەگۆڕ | ٩٩ |

